






android







## -1 Android ...................................................... چیە ؟

بە کورتی و بەکوردی ئەندرۆید سیستەمێکە وەك
(Symbian ) و (Windows Mobile) و (IOS) بەڵام ئەندرۆید ( Open
Source)ە وە تایبەت دروستکراوە بۆ مۆبایل و ئامێری تەخت وە هەروەها چەندین
ئامێری تر.وەهەروەها لە بنچینەدا لەسەر سیستەمی لینوکس دروستکرایە



## Kernel -2 ..............................................چیە ؟

بریتیە لە ناوکی سیستەم . گرنگترین بەشی سیستەمە ڕاستەوخۆ کار دەکات لە نێوان هارد وێر و سۆفت وێر. وەهەروەها داتا لە بەرنامەوە وەردەگری و دەیگوازتەوە بۆ پرۆسیسەر وە بە پێچەوانەوەش



## 3- ROM ......................................... چیە ؟

ڕووم واتا بە شێوەیکی گشتی سیستەمە واتا سوفت وێری ئامێرەکەت ئەوە ڕوومی پێدەڵێن. ڕووم یش دوو جۆری هەیە یەکەم ئەو ڕوومەی بە شێوەکی فەرمی لە لایەن کۆمپانیای دروستکەری ئامێرەکە دەردەچی ئەوەیان ڕوومی فەرمی پێدەڵێن . دووەم جۆر ڕوومی دەستکاری کراو کە لە لایەن شارەزایانی بواری بەرنامەسازی پەرەی پێدەدرێ و دەستکاری دەکرێ. بڵاو ترین ڕووم ی دەستکاری کراو ئەومانەی خوارەوەن

1- Paranoid
2- SlimKat custom
3- AOKP custom ROM
4- PAC-ROM
5- CyanogenMod باشترین و سەرکەوتوترین ڕووم کە زمانی کوردیشی تێدایە
6- Cataclysm
7- Resurrection Remix
8- Dirty Unicorns
9- XenonHD
10- BlissPop



## 4- Root ........................................................چیە ؟

ڕووت :- بریتیە لە کرداری پێدانی دەستهەڵاتی تەواو بەسەر سیستەمەکەت.

تێبینی:- ڕووت گرنتی ئامێرەکەت ناهێڵی واتا تۆ ئەگەر ئامێرەکەت ڕووت بکەی ئەوە گرەنتی نامینێ .

وەهەروەها گرنگترین سوودەکانی ڕووت بریتیە لە :-

1- پێدانی دەستهەڵات بۆ دەستکاری کردنی فایلەکانی سیستەم .
2- دروستکردنی باك ئاپ ی تەواوی سیستەمەکەت و گەڕاندنەوەی.
3- گۆڕینی و دروست کردن و دەستکاری کردنی فۆنت و شێوەی ئامێرەکەت واتا theme .
4- سڕینەوەی ئەو بەرنامانەی کە لەگەڵ دانانی سیستەم بەخۆکاری دادەمەزرێ
5- ئیش پێکردنی هەندێ بەرنامە کە داوای دەستهەڵاتی ڕووت دەکەن

وە هەروەها چەندین سوودی تریشی هەیە.



## 5- Fastboot ...........................................چیە ؟

واتا بووت وەك بووتی کۆمپیوتەر وایە کاتێك دەتوێ فۆڕماتی کەوەیەوە بەڵام لە ئەندرۆید جیاوازە بۆچوونە سەر **Recovery** بە کار دێ لەوێش دەتوانی فۆڕماتی بکەیەوە یان ڕووم تازە دامەزرێنێ . بۆ چوونە سەر باری **Fastboot** ئەوە مۆبایلەکەت دەگوژێنیەوە و پاشان بەنجە بە دوگمەی پاوەر و هۆم و دوگمەی دەنگ بەرزکردنەوە دادەگری.

Android system recovery <3e>
KLB20.9-1.10-1.24-1.1

Volume up/down to move highlight;
enter button to select.

reboot system now
apply update from sdcard
apply update from ADB
wipe data/factory reset
wipe cache partition



## 6- CWM and TWRP ........................................چیه ؟

هەریەك لەوانەی سەرەوە بریتین لە ڕیکۆڤەری لە سەرەوە باسی ڕیکۆڤەریمان کرد ئەو دوو جۆر ڕیکۆڤەریە بۆ ئەو ئامێرانە دادەندرێن ئەگەر بمانەوێ ڕوومی چاککراو یان ڕوومی دەستکاری کراو دابەزێنین یان بۆ ئینستۆڵ کردنی فایلی لە شێوەی Zip کە زۆر جار لەگەڵ گۆڕینی ڕووم کێشە بۆ کامیرە یان وای فای یان هەر بەشێکی تر درووست دەبی دەتوانی لە ڕێگەی ئینستۆڵکردنی فایلی تایبەت بە چاکردن چاکی بکەی ئەوەی جێ ئاماژەیە ئەوەیە کە ڕیکۆڤەری ستاندار ناتوانی هەموو کارێك بکات بەڵام ئەگەر ئەو دوو جۆرە ڕیکۆڤەریەت دانا کێشەت نابێ. یان بۆ باك ئاپ کردنی سیستەم یان بۆ ڕێستۆری سیستەم وە هەروەهاا..........

تێبینی:- هەردوو ڕیکۆڤیریکە پاڵپشتی تەچ دەکات



**7- ADB ................................................چیە ؟**

**کورتکراوەی ( Android Debug Bridge ) بۆ چەند مەبەستێك بەکاردێ گرنگترینیان:-**

**دەتوانی پەیوەندی بە ئامێرەکەتەوە بکەی بۆ دابەزاندنی ڕیکۆڤەری CWM وە هەروەها دابەزاندنی بەرنامە و بەهەموو جۆرەکانی وە چوونە سەر بووت لۆدەر و ڕیکۆڤەری مۆد و جێبەجێکردنی هەرندێ فرمانی تر.**

**بەکورتی دەتوانی بڵێ بۆ دروستکردنی پردی پەیوەندیە لە نێوان کۆمپیوتەر و ئامێریەکەت بەکاردێ.**



**8- Odin ..............................................چیه ؟؟**

به كورتی بەرنامەیەك بەكاردێ بۆ دابەزاندنی ڕوومی فەرمی و ڕوومی دەستكاری كراو بۆ سەر ئامێرەكەت. ئیشپێكردنی زۆر ئاسانە تەنها ئامێرەكەت ببە سەر داونلۆد مۆد و پاشان بە كێبڵ بە كۆمپیوتەری ببەستەوە و ڕوومەكە ئینستۆڵ بكە.

تێبینی :- داونلۆد مۆد وەك شێوەی ڕیكۆڤەری مۆد دەچیە سەری لە ڕێگەی دوگمەی پاوەر و هۆم و دەنگ نزمكردنەوە یان لە ڕێگەی **adb shell** وە دەتوانی بچیە سەری بە نوسینی فرمانی **Reboot download**



## 9- Superuser ................................................چیە؟

بەرنامەیەکە لە ڕێگەیەوە دەتوانی کۆنترۆڵی پێدانی دەست هەڵاتی ڕووت بکەی بۆ هەندێ بەرنامە کە پێویستیان بە دەستهەڵاتی ڕووت هەیە



**10- BusyBox ............................................... چیه؟؟**

بریتیه لە بەرنامەیەك لە ڕێگەی ئەو بەرنامە دەتوانی هەندێ فرمانی یونکس بەکار بینی . کە لە سیستەمی ئەندرۆید ئەو فرمانانە دانەندراوە وە لە ڕێگەی ئەو فرمانانەوە دەتوانی هەندێ بەرنامە ئیش پێبکەی کە پێویستیان بەو فرمانانە دەبی . تێبینی ئەو بەرنامەیە و وە هەروەها ئەوبەرنامانەی کە پێویستیان بە **BusyBox** هەیە پێویستی بە دەستهەڵاتی ڕووت هەیە



لە کۆتای دا هیوادارم سوودی هەبێ و لە کەم و کوڕیەکان چاوپۆشی بکەن

**ANGRY BOY**

**WWW.H4KURD.COM**

**E-MAIL: H4KURD@YAHOO.COM**

**2016/3/5**